# سیستەمی بەندەو کەنیزەك لە ئیسلامدا

Sistami Bandaw Kanizak La Islamda

la bar tishki roshni ayatakani quran o farmoda


نووسینی پێشەکی ئاوات کەکوکی

ئامادەکردنی : کۆمەڵی رزگاربوو



کۆمەڵی

رزگاربوو



# سیستەمی بەندە و کەنیزەک لە ئیسلامدا

**نوسینی : کۆمەڵی رزگاربوو**
**پێشەکی بۆنوسین : ئاوات کەرکوکی**

بسم الله الرحمن الرحيم

إِن الْحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِالله مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ..

اما بعد:

خوێنەری بەڕێز ئەمەی لەم كتێبەدا ئەیخوێنینەوە ، روونكردنەوەی باسێكی شەرعیە بە دەقی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و فەرمودەكانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ،هاوپێچ لەگەڵ گوتەی زانایانی پایەبەرزی ئیسلام لە كۆن و نوێ دا ، كاتێك ئەڵێین زانایانی ئیسلام مەبەست لەم كەسە بە هەڵمەت و بە هەڵوێستانە بوون كە بۆ هیچ مەبەرست و مەرامێكی كورتی دنیایی زانستەكەی خۆیان بەكار نەهێنا بەڵكو خستیانە خزمەتی ئیسلامەوە ، ئیسلامیان بەجوانی و پاكیەكەی خۆی دەست بەدەست هێنا هەتا گەیاندیان بەدەستی ئێمە ، بۆیە ئەركی سەرشانی هەریەكێك لە ئێمەیە كە وەك واجبێكی شەرعی و هاوكات وەك وەفایەكیش بۆئەم زانا بەڕێزانە ،پاداشتی خزمەت و ماندوبونەكەیان لەبەرچاو بگرین ، پاداشت دانەوەی زانایان تەنها لەڕێگای كردنی دوعای خێر بۆیان و هەروەها بلاو كردنەوەی زانستەكەیانە بە ئەمانەتەوە .

ئەگەر ئەمە بكەین هەم لەلایەن خوداوە خاوەنی پاداشت ئەبین ،هەم خۆمان و دەروبەریشمان سود مەنەد ئەكەین بە زانستی بەرزی ئەم زانا بەڕێزانە ، لەمانەش گرنگتر هۆكاریكە بۆ ئەوەی كە دوژمنانی ئیسلام ،هەروەها هەل پەرستانی گەندەخۆر كە بەناوی ئیسلامەوە لەسەر ئیسلام ئەلەوەڕێن ناتوانن ، چەواشەمان بكەن.

ئەم کتێبەی بەردەستان یەکەم بەنیەتی ڕەزامەندی خودای گەورە نوسراوە و پاشان بۆ ئەم مەبەستانەی کە لەسەرەوەدا باسمان کرد،کەڵك وەردەگرین.

ئەم کتێبە هەرچەندە کورتە بەڵام پوختەیەکی باشە بۆ ناساندنی باسی ( کەنیزەك ) و چۆنیەتی و حوکمەکانی بە پێی دەقە شەرعیەکان ، لەم کتێبەدا بەرادەیەکی زۆر باش ڕێکارە شەرعیە ڕێگا پێدراوەکان و چونیەتی ماف و ئەرکی خاوەندار بۆ کەنیزەک و هەروەها کەنیزەک بۆ خاوەنەکەی ڕوون ئەکاتەوە پشت بەخوا.

لەهەمان کاتدا بەرپەرچی تانەو تەشەری دوژمنانی ئیسلام ئەداتەوە کە باسی کەنیزەکیان بەشێوەیەك لەلای خەڵکی خۆیان هەتا لای هەندێک لە موسوڵمانانی ناشێ چەواشەکردوە.

هاوکات بەرپەرچی هەندیك دەمەوەری مشەخۆر بەناو زانا و بانگخوازی ئیسلامیش ئەداتەوە کە هەر لەباسی کەنیزەك و زۆر باسانی تری شەرعی دا لەهەندێ کاتدا توند تر و ناشرینتر لە کافرەکان ، ئەحکامەکانی شەرع تانە لێ دەدەن و خەڵک چەواشە ئەکەن .

بەتایبەت لەم باسەدا حوکمی کەنیزەک لە ئیسلامدا بەجۆریك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن باسی لێوە ئەکەن ، هەندێ بە شەرم و خەجاڵەتی و هەندێکی تر بە پەڵەی ڕەشی ئەزانن بەناوچەوانی ئیسلامەوە ، هەندێکی تر هەر نەهی لەبونی حوکمێکی لەم شێوەیە ئەکەن لەئیسلامدا بونی هەبوبێت ، یاخود ئەڵێن کاریکی ناشەرعیە و شەرع ڕێگای پێ نەداوە بەلام پێغەمبەر و یاوەرەکانی بۆ ماوەیەکی کاتی کاریان پێ کردوە پاشان بن بڕ کراوە ( خوا پەنامان بدات لەم گوتە کوفریە )، نمونەی وەک (عەلی باپیری ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی) کە چەندین جار بۆ کەناڵەکان دواوە بەتایبەت لەکەناڵی ڕووداوی زمان حاڵی پارتەکەی بارزانی بەئاشکرا وبێ شەرمانە ئەیوت حوکمی کەنیزەك تەنها ڕاوبۆچونی چەند زانایەکی ئیسلامی بوە هیچ دەقێکی شەرعی لەسەر نیە ولەسەری نەهاتوە ، شایەنی باسە تەنها عەلی باپیر نیە ئەم ناماقوڵیەی کردبێت بەلام ئەمە مشتێکە لە خەرمانێك کە لەم کتێبەی بەردەستان بە ئایەتی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرپەرچی چەواشەکاریەکانیان ئەدەینەوە .

بەلام پێویستە ئەمە بزانن کە کەنیزەك ئیسلام داینەهێناوە ( لەناوەڕۆکی کتێبەکە زیاتر ڕوونی ئەکەینەوە ) هەروەك فرەژنی کە ئەم حوکمانە و زۆری تریش لەپێش ئیسلامدا لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بونیان هەبوە ،بەڵکو ئیسلام هات ئەم زوڵم زۆری و نادادپەروەریەی لەلایەن چینێك یان دەستەیەک لە کۆمەڵگاوە دژ بە تەواوی کۆمەڵگا یان بەشێك لەکۆمەڵگا پەیرەو ئەکرا ئیسلام هات و دادگەری سەپاند لەنێوان تاکەکان و لەنێوان رەگەزەکاندا.

ڕەگەزێك لەم ڕەگەزانەی مرۆڤ کە ئافرەتە بەر لە ئیسلام زۆرترین زوڵم بەئاراستەی ئافرەت بوو ،بەهاتنی ئیسلام ئافرەت جوانترین نرخ و بەهای وەرگرت، لەپیاو مەزنتر نیە بەلام لە پیاویش کەمتر هەژمار نەکراوە ، بەپێی ئەرکەکانی خۆی مامەڵە و فەرمانی بۆ دیاری کراوە بەلام لە مافدا لەهیچ کوێ یەك لە پیاو جیا نەکراوەتەوە،دەیان بەڵگەی قورئانی هەیە کە خوای گەورە لە کردنی کاری چاکەدا هەمان ماف و پاداشت کە بۆ پیاو دانراوە بۆ ئافرەتیش بەهەمان شێوە ، وەک ئەفەرموێت:

﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ [1] بە واتایی؛ ئەوەی کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی کە ئەوان دەیانکرد. ئەوەتا خوای گەورە بە یەکسانی باس لە پاداشتی چاکەکاران ئەکاتەوە لە ئافرەت و پیاو وەک یەك و هاوشانی یەك.

یان دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴾[2]بە واتایی؛ ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێناکرێت.

[1] (النحل- ٩٧ )
[2] (النساء-١٢٤)

بەهەمان شێوە لە سزادانیشدا خوای گەورە سزای ئافرەتی لە سزای پیاو جیاوازتر دانەناوە بەڵکو هەمان سزایان هەیە چۆن هەمان پاداشتیان هەیە وەك ئەفەرموێت:

﴿ا لزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ ..﴾[1]بەواتایی: سەد قامچی لەهەریەك لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان. ئادەی کوا جیاوازی لە نێوان پیاو ئافرەتدا کە ئیسلام فەرمنای پێی کردبێت .

وە خوای گەورە ئەفەرمویّ : ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾[2]بە واتایی: دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی کاری ناڕەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەکە لە لایەن خواوە، خوا باڵادەست و دانایە (لە بڕیاردانی ئەو سزایەدا، ئەڵبەتە ئەم سزایە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا جێبەجێ دەکرێت). ئەمە تێروانینی ئیسلامە بۆ ئافرەت لە مافدا کە هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ پیاو بەلام لە کاردا بێ گومان ژن ڕەگەزیکی جیاوازە لە پیاو ، هەندێک کار هەیە شایەن بە ئافرەتەو بە پیاو ناکرێت بەهەمان شێوە هەندێ کاریش هەیە تایبەتە بە پیاو بە ئافرەت ناکرێت ئەمەش زوڵم نیە لە ڕەگەزیکیان بەڵکو ئەمە لە زەروریەتەکانی ژیانە.

مێژوو شاهیدە بەر لەوەی ئیسلام بێت ئافرەت بونی مایەی شەرمەزاری بوو لە کۆمەڵگا دا، جوانترین مامەڵەی کە لەگەڵدا ئەکرا تەنها بۆ تێرکردنی ڕەگەزی نێرینە بوو هیچی تر.

ئافرەتان بەر لەئیسلام کۆیلەیەکی بێ ماف بوون و سەوداو مامەڵەیان پێوە ئەکرا ، بەمەرجێك ئەگەر جوان ڕوخسار بونایە خۆ ئەگەر لە ڕوخساردا بەدڵی تەماع کارانی رەگەزی نێرینە نەبونایە بێ هیچ یاسایەک ئەکوژران، ئێستاش لەهەرە بەناو کۆمەڵگە پیشکەوتوەکاندا بە نمونەی ئەوروپا پیاوان و ژنان لە شوێنی کارکردنیاندا کەهەمان کار ئەنجام ئەدەن بەلام کریی پیاوەکە زیاترە لە کرێی ئافرەتەکە.

1 (النور-٢)

2 (المائدة-٣٨)

مێژوو بخوێنەوە بەر لەئیسلام پاشاکان خوەنی دەیان ژن بوون هەبوە خاوەنی ٤٠٠ ژن بوە لەیەك کاتدا وەک پادشای بابل ،کە ئافرەتانی هەڵبژرادە بوون لە جوانی دا ، ئەم ئافرەتانەی لای پاشاکان یان بەدیاری بۆیان ئەهاتن لە پاشا و فەرمانرەوا کەم دەستەکانەوە یان لەکاتی جەنگدا بەدیل ئەگیران جوانەکانیان بۆ پاشا و فەرمان رەواکان بوو ناشرینەکان ئەکرانە قوربانی بەردەم خوا دروست کراوەکانیان.

ئیسلام هات قەدەغەی کرد پیاو هەر پیاوێك بێت لە ٤ ژن زیاتر بۆی نیە لەیەك کاتدا هەیبێت و بەمەرجی گرتوە دادگەری لەکاتی بونی یەك ژن و لەیەك ژن زیاتر بۆی نیە ، ئاخر کەسێك خاوەنی ٤٠٠ ژن بێت دادگەری جۆن بەڕێوە ئەچێت و مافی ئەم ئافرەتانە لەکوێ دەست ئەدرێت و بەکێ ئەدرێت ؟! ئەمە ئیسلام بوو هات ئەم زوڵمەی لەسەر ئافرەت هەڵگرت نەك ئیسلام زولّی کردبێت پەنا بەخوا لە ئافرەت.

لاتان سەیر نەبێت و لە دنیای ئەمرۆشدا ماون ئەوانەی ئێستاش چاوی تەماعیان زیاتر لە ٤٠٠ ئافرەتە ،چونکە کە کەسەکە موسوڵمان نەبوو ئیتر سنورێکی نیە لێی بوەستێت و رایگرێت ، مەگەر نەتانبیست لە رۆژنامەی ئاوینە گەورە بەرپرسیکی یەکێتی نیشتیمانی ئەڵێت لەگەڵ ٢٠٠ ئافرەت رامبواردوە! لەبەرامبەر دامەزراندنیاندا ؟! مەگەر داوێن پیسی بەرپرسەکانی ترتان لە پارتی و یەکێتی و حزبە عەلەمانیەکانی تر ئاگا لێ نیە چۆن سوکایەتی بەئافرەت ئەکەن لە نەبون و کەنار خستنی ئیسلامەکەدا ، ئەوە تەنها ئیسلامە ئەتوانێت و توانیویەتی دادگەری لەنێوان مرۆڤەکان و هەروەها مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ و دارستان و ژینگەشدا ڕێك ئەخات.

لەگەڵ ئەم هەموو راستیەدا لە سایەیی نەبونی دەسەڵاتی ئیسلامی داوێن پیسەکان ، گورگە چاوچنۆک و بەد ڕەوشتەکان دەستی چەوری خۆیان بەسەری ئیسلام ئەسڕن و ئەڵێن ئیسلام زوڵمی لەئافرەت کردوە ، لەبری رەد دانەوە بابای بەناو ئیسلامی لەپەرلەمان دانیشتوە بۆ دەنگدان لەسەر یاسای فرەژنی کە گوایە ئیسلام رێگای داوە بە ٤ ژن ئەمە خوا زوڵمی کردوە لە ئافرەت ئەبێت ئەم زوڵمەی خوا لابەرین(پەنا بەخوا )، کاکە یان دادەی ئیسلامی پاساوی دانیشتنی لەم پەرلەمانە کوفریەدا ئەوەیە کە ئەو بە نەخێر دەنگی داوە ! ئەپرسین چۆن

ڕێگاتاندا بڕیاریکی ئاوەها یان دەیان بڕیاری لەم چەشنە بخرێتە دەنگدان بۆ خەڵکی موسوڵمانتان هان نەدا بڕژێنە سەر شەقامەکان ؟ ئەی بۆ کە یەک مانگ مەعاش وەرناگرن دەمتان وەک مەقەستی تیژەوەکراو لەراگەیاندنەکان بەکاری ئەهێنن بەڵام بۆ سوکایەتی بەخوا و شەریعەتەکەی سەرتان شۆر کردوە ؟!.

جا بۆئەوەی تاکی کورد نەخوێندەوار نەبێت یان لەلایەن ئەم بەناو موسوڵمانانە نەگەوجێندرێت ، بەفەزڵی خوا هەوڵدراوە لەم کتێبەدا تێ بگەین کە کەنیزەک ڕێگرتنە لە کوشتنی ئافرەت و ڕێگرتنە لە کردنی ڕەفتاری ناشایستە و دوور لە مرۆڤانە لە ئافرەت، تێ بگەین کە ئیسلام یاسای بۆ ئەم ئافرەتانەش داناوە کە لەجەنگدا ئەگیرێن ،بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی دڕندانەیان لە ئاستدا نەکرێت .

بەخوێندەوەی ئەم کتیبە لە مانای کەنیزەک و ئەرک و مافەکانی تێ ئەگەین ان شاء الله بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە ئەوە هەر ئیسلامە رێگری ئەکات لە کاری درندانە و زوڵم کردن لە ئافرەت ، لەمەش تێ ئەگەین کە دوژمنانی ئیسلام ، بەچی چەشنێك زوڵم لە خوشکانی ئێمە ئەکەن لە زیندانەکاندا.

ئیسلام زوڵم لە ئافرەتانی کافران ناکات بەڵکو بەجوانترین شێوە ڕێگا وڕیکاری بۆ موسوڵمانان و موجاهیدان داناوە لەحاڵەتی جەنگدا چۆن مامەڵە لەگەڵ ژن و مناڵی دوژمناندا ئەکرێت کە کافر و موشریکن ، بەلام کافران  و مورتەدان کە خوشکانی ئێمەیان ئەکەوێتە بەردەست بە درندانەترین شێوە لە زیندانەکاندا کۆیلە ئەکرێن و  ئەتکی ناموسیان ئەکەن و ئازار و ئەشکەنجەشیان ئەدەن ، هەتا لە تینویەتی و برسیەتی دا سەر ئەنێنەوە ، کەچی بابای بەناو ئیسلامی لەجیاتی رەخنەگرتن و بەگژا چونەوەی ئەم زوڵمەی کافرەکان دێت یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی بە زوڵم و زۆری ئەناسینێت پەنا بەخوا.

وصلی الله علی نبینا محمد وعلی اله وصحبه وسلم.

ئاوات کەرکوکی

٢٠١٥/٠١/١٥ بێرمینگهام – بەریتانیا

## دەستپێکی نوسەر

کەنیزەک شتێکی تازە نییە ئیسلام هێنابێتی، بەڵکوو هەموو میللەت و نەتەوەکان و دین و کۆمەڵەکان کەنیزەکیان گرتووە و بگرە لە کارە سروشتی و ئاساییەکانی ژیانیان بووە، نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو کەنیزەک موڵک و ماڵی زۆرێک لە دەوڵەمەندەکان بوون و مامەڵە و بازرگانیان پێوە کردوون، کاتێک ئیسلام هات بەکەنیزەک کردنی ئافرەتان دەرگای زۆر بوو، بەکڕین و فرۆشتن، بەداگیرکردن، دزین و فڕاندن، جەنگ و هەڵکوتانەسەر، لەباتی قەرزدانەوە، ....

عەرەبی پێش ئیسلام و هەردوو ئیمبراتۆرییەتی فارس و ڕۆمان و هەموو هێز و دەستەڵاتێکی تر بەکەنیزەکردنی ئافرەتانیان لەلا پیشە و دابونەریت بوو، نمونەی ئەوانەش لەزۆری و ئاشکراییدا پێویست ناکات وێنەیان لەسەر بخەینەڕوو.. بەلام ئەوەی جێگای داخ و ئەسەفە کەسانێك بەناو ئیسلامەوە بێن بڵێن ئەو حوکمە نیە لە ئیسلامدا یان ئیسلام نەیهێشتوە یان حەرامی کردوە یان بۆکاتێکی دیاری کراو بوە !!!وەك ئەوەی خوا لەبیری چووبێ یان پێغەمبەرەکەی نەیزانیبێ و ئەوان ئەزانن کە سوودی نەماوە و بەکەڵك نایات !!بۆیە ئەوکەسانە بەئاشکرا دیارە کە کاریگەری بیروباوەڕی ئەهلی کوفریان لەسەر کراوە لە عەلمانی و نەوتەوە پەرست و عەقل گەراو ئینسان پەرستەکان پاشان ئەوەندە ئیمان و عیلمەشیان نیە کە بتوانن بەرپەرچی ئەوان بدەنەوە چونکە لە روخانێکی دەرونی شڕدا ئەژین کە زەلیل بوونیانە بۆ لەتەنانێك کەکافر بۆیان فڕێ ئەدات جا لەو کەسانە هەیە رۆژنامە نوسێکی بەناو ئیسلامیە یان مەلایەکی کاسە لێسە بوق لێدەری کۆشکی تاغووتانە ، لێرەدا هەول ئەدەم پوختەیەك لەوبارەیەوە بخەمەروو .

سەرەتا ئێمە ئەبێ بزانین چ دینێکمان هەیە ئەگەر ئیسلامە ئەبێ بزانین ئیسلام یانی چی و لە چی وە هاتوە ؛ ئیسلام _لە واتای تەسلیم بوونەوە هاتوە واتە ملکەچ بوون بۆ خوا بەوەی هەواڵەکانی بەڕاست بزانی و حوکمەکانی وەکو خۆی وەربگری تەنها لەوەدا دادپەروەری ببینی ، بەبێ گومان و دوودڵی ، جا ئایا تۆ کاتێك ئەڵێی من لەسەر بەرنامەی ئیسلامم ملکەچ بویتە بۆ هەموو بەرنامەکەی ئیسلام یان نا چونکە خوای گەورە ئەفەرمێ :

﴿ ٱدخُلُواْ فِي ٱلسِّلمِ كَآفَّةً ﴾ واتە : بچنە دینی ئیسلامەوە و ملکەچی بن بەگشتی ، وە خوای گەورە ئەفەرمێ : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَينَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤمِنُ بِبَعض وَنَكفُرُ بِبَعض وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَينَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾[1]

{إن الذين يكفرون بالله ورسله} بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن بە خواو پێغەمبەرەکانی{ويريدون أن يفرقوا بين الله ورسله} و دەشیانەوێ لەنێوان خواو پێغەمبەرەکانییدا یان لەبریارەکانیاندا فەرق و جیاوازی دانێن ، ئەمرۆ چەندین بەناو موسڵمان هەیە کە ئینکاری ئەوە ئەکات کەنیزەك لە ئیسلام هەبێ بەلکو سوکایەتیشی پێ ئەکات و بەناشەرعی و کارێکی قیزەونیشی ئەزانێ {ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض} و دەڵێن: ئێمە باوەڕ بەهەندێکیان دەکەین، هەندێکیشیان بەجێی باوەڕ نازانین {ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا} و دەشیانەوێ لەو نێوانەدا ڕێگەیەك بۆخۆیان دیاری بکەن.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلكَٰفِرُونَ حَقّا وَأَعتَدنَا لِلكَٰفِرِينَ عَذَابا مُّهِينا﴾

{أولئك هم الكافرون حقا} بێ دوودڵی، ئەمانە کافرو خوا نەناسن، چونکە ئەو داوایەیان ناپەسەندە، چونکە بڕوا بوون بەخوا، بڕوابوونە بەگشت فەرمان و بڕیارەکانی، ئەگینە ئەو داوایە، داخوازییەکی بێهوودەو بێ ناوەڕۆکە{وأعتدنا للكافرين عذابا مهينا } وە ئێمە سزایەکی ئابڕووبەرمان بۆئەو خوانەناس و کافرانە، ئامادە کردووە، بۆیە چاك بزانن هەر ڕەتکردنەوەیەکی حوکمێك لە حوکمە شەرعیەکانی خوای گەورە بریتیە لە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و هەڵوەشانەوەی ئیمان خوای گەورە لەوبارەیەوە ئەفەرمێ : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤمِن وَلَا مُؤمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلخِيَرَةُ مِن أَمرِهِم وَمَن يَعصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَد ضَلَّ ضَلَٰلا مُّبِينا ﴾[2] ژن و پیاوی موسڵمان، نابێ لە فەرمانی خوا دەربچن: **پێشەوا ئەحمەد لە (ئیبن عەباس)ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:** پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾(زەینەب)ی کچی(جەحش) یخواست بۆ (زەیدی کوڕی حاریس)ـە، بەڵام زەینەب پێی عەیب بوو مێردی پێ بکاو، بۆخۆیشی ژنێکی زۆر تەبیعەت توندبوو، بۆیە وتی: من لەرووی حەسەب و ڕشتەوە زۆر لەو

[1] **(النساء-١٥٠)**
[2] **(الأحزاب ٣٦)**

-

باشترم! ئەوجا خوای گەورە فەرمووی: {وما كان لمؤمن ولا مؤمنة} بۆ هیچ پیاوو ژنێکی بڕوادار نیە {إذا قضى الله ورسوله أمرا} کاتێ خواو پەیامبەرەکەی بڕیاری کارێکیان دا {أن یکون لهم الخيرة من أمرهم} سەرپشككرانیان بۆهەبێ لە کارەکەیاندا، واتە: بۆیان نیە خۆیان بارێك هەڵبژێرن، بەڵکو دەبێت بێ سەرلێکردنەوە فەرمانبەردارو ملکەچ بن. هەروەك لەئایەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ....﴾دا هاتووەو، پێغەمبەریش دەفەرمووێ: (لایؤمن أحدکم حتی یکون هواه تبعا لما جئت به ) ئەمانە گشت ئەو راستیە دووپات دەکەنەوە کە دەبێ موسڵمان هەمیشە گوێڕایەڵی لە خواو لە پێغەمبەرەکەی بکەن و، نابێ بۆ خۆی- بێجگە لەوە - بڕیارێکی تر بدات. **(ئیبن کەسیر)یش ئەڵێت:** ئەم ئایەتە هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، کەوابوو هەرکات خواو پەیامبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ بڕیاری شتێکیان فەرموو لە هەر بوارێکدا، ئیتر ئەبێ هەرئەوە پیادە بکرێ، ئەگینا یاخیبوون و سەرپێچیە: {ومن یعص الله ورسوله} هەرکەسێك سەرپێچی بکات لەفەرمانی خواو پەیامبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ بەوشێوەیە کە جگە لەبڕیارەکانی ئەوان- کارێکی دی هەڵبژێرێ بۆ خۆی {فقد ضل ضلالا مبينا} ئەوە بێگومان گومڕا بووە، بە گومڕابوونێکی ئاشکرا. وە خوای گەورە ئەفەرمێ : ﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ واتە : وتەو گوفتاری بڕوادارەکانیش کاتێ بانگ دەکرێن بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا داوەری بکا {أن یقولوا سمعنا وأطعنا} هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەوا بیستمان و گوێڕایەڵیشین. واتە: ئەگەر ئەوانیش بڕوادار بوونایە، دەبوو هەر ئاوایان بووتایە {وأولئك هم المفلحون} ئائەوانە - کە بۆ رەزامەندی خوا پەلە ئەکەن- سەرفرازی راستەقینەی دونیاو قیامەتن .

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾[1]تا شەرعی خوا نەکەنە بەرنامە، موسڵمان نین: {فلا وربك لا یؤمنون} نەخێر وەك ئەوە نییە دووڕووەکان دەیزانن، سوێندبێ بەپەروەردگارت ئەی پێغەمبەر نابنە باوەڕدار {حتى يحكموك فيما شجر بينهم} تا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی

[1] ( النساء-٦٥ )

نێوانیان تۆ دەکەنە داوەرو رازی نەبن بەدینەکەت {ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت} و ئەوساش بەرامبەر بەوبڕیارەی تۆ داوتە، هیچ تەنگیەکیان نەبێ لەدەروونیاندا {ويسلموا تسليما} و بەچاکیش تەسلیم و ملکەچ بن. بەڵێ دەبێ ملکەچی و ڕەزامەندیی تەواومان هەبێ بۆ هەموو بڕیارەکانی خواو پەیامبەر ﴿ﷺ﴾ هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا...﴾

بروانن لە جەنگی ئەحزاب کە هەموو حیزب و زلهێزان کۆبونەوە بۆ لیدان و لەناوبردنی دەولەتی ئیسلامی لەمەدینە کە تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو بۆ موسڵمانان تا دەربکەوێ کێ دڵەکەی جێگیر ئەبێ لەسەر ئیمان و مانەوە لەگەل ئیسلام، ئەوە بوو ئەو هەموو نارەحەتی و ناخۆشیە لە جێگیری و ئیمان زیاتربوون و ملکەچی زیاتر هیچیتریان بۆ زیاد نەبوو نەك وەك بەناو ئیسلامیەکانی ئەم سەردەمە بەرەخنەیەکی ئەهلی کوفر هەزار تەنازول ئەکەن لە دینەکەیان !!خوای گەورە بۆمان ئەگێڕێتەوە ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴾[1]

{ولما رأي المؤمنون الأحزاب} جاكە بڕواداران ئەو هەموو لەشکرو دەسەڵاتەی حیزبەکانیان چاوکرد کە بەرەو ڕوویان دەهاتن بۆ مەدینە {قالوا هذا ما وعدنا الله ورسوله} گوتیان: ئەمە هەرئەو بەڵێنە بوو کە خواو پەیامبەرەکەی پێیاندابن،واتە: لەپێشەوە بەڵێنیان پێداین بە ڕۆژە دژوارو سەختەکان، لە پاشان بە یاریدەدان و سەرکەوتن {وصدق الله ورسوله} خواو پەیامبەرەکەی راستیان فەرمووە. **(ئیبن عەباس)دەڵێ:** مەبەست بەو ئایەتەش کە لەسوورەتی (بەقەرە)دایەو دەفەرموێ:﴿.. مستهم البأساء والضراء وزلزلوا حتى يقول الرسول والذين آمنوا معه متى نصر الله ألا إن نصر الله قريب ﴾.هەربۆ هەمان ماناو مەبەستە {وما زادهم إلا إيمانا وتسليما} ئەورووداوە کەبەو جۆرە پێش هات، باوەڕدارەکان پتر باوەڕو ملکەچییان زیادی کرد ،

[1] (الأحزاب ٢٢ ) –

بەهەمان شێوەش كاتێ قیبلەی موسلمانان سەرەتا رووكردنە بەیت المقدیس بوو بۆ ئەوەبوو تاقی بكرێنەوە ئایا كێ قبولی ئەكات و مەلكەچ ئەبێ وەك خوای گەورە ئەفەرموێ :

﴿وَمَا جَعَلنَا ٱلقِبلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيهَآ إِلَّا لِنَعلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيهِ وَإِن كَانَت لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ...﴾

وەبەهەمان جۆر كاتی صولحی حودەیبیە كە موسلمانان بەتەمای عومرە كردن بوون كافرەكان ریگرییان كرد پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی كرد نەچن هەر لە حودەیبیە قوربانیەكانیان سەربڕن كۆمەڵی سەحابە لەسەر دلیان توندبوو سەرەتا ، كەچی تاقیكردنەوەیەكی خوایی بوو ، بۆیە زۆر ئاگاداربن لەوەی رقتان لە حوكمێكی شەرعی ببیتەوە یان رازی نەبن پێی كە زۆرجار بۆ ئەوەیە تاكو تاقیبكرێنەوە بەهۆیەوە، ئایا جێگیر ئەبن لەسەری یان نا بەتایبەت لەم سەردەمە كە بێباوەران بەهەموو رەنگەكانیانەوە گەلەكۆمەیان كردوە لەموسلمانان بۆ تەنازول كردن لە دینەكەیان ئەگەر تەنها بەشێكیش بێت وە زۆریكیش بەدەمیانەوە چوون ..

## سیستەمی كۆیلە و كەنیزەك جێگیربوە لە ئیسلامدا بەبەڵگەی قورئان و سونەت و ئیجماع :

پێش هەموو شتێك پیویستە بزانین كەسێك كەكافرە خوێن و مالەكەی حەڵالە بەهۆی ئەو كوفرەی كە تیایەتی ئەمە بەڵگەیەكی گشتیە لەسەر ڕەوا بوونی بە كۆیلە كردنی كافر لە ئیسلامدا وەكو ئیمامی شەنقیطی ئەفەرمێ :

**(وسبب الملك بالرق: هو الكفر، ومحاربة الله ورسوله، فإذا أقدر اللهُ المسلمينَ المجاهدين الباذلين مُهَجهم وأموالهم وجميع قواهم وما أعطاهم الله لتكون كلمة الله هي العليا على الكفار: جعلهم ملكاً لهم بالسبي إلا إذا اختار الإمام المنَّ أو الفداء لما في ذلك من المصلحة للمسلمين)[1].**

(1)أضواء البيان " (٣٨٧/٣ )

واتە : هۆی کردنە کۆیلە کوفرە ، و بەرهەڵستی کردنە لەگەل خواو پێغەمبەر، بۆیە ئەگەر خوا بەخشیە موسلمانان و موجاهیدان کە گیان و مالیان بۆ خوا تەرخان کردوە بۆ ئەوەی دینی خوا بەرزەوەبکەن ، ئائەو کاتە کە زاڵ بوون بەسەر کافرەکاندا بۆیان هەیە ژن و مال و مناڵیان بەکۆیلە بەرن، یاخود ئەمیرەکەیان سەرپشکیان ئەکات لە نیوان ئازادکردن یان فدیە دان ئەوەش بەپێی بەرژەوەندی موسڵمانان.

## بەڵگە لە قورئاندا دەربارەی بوونی کۆیلە کارپێکردنی زۆرە لەوانە:

١- خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴾[1]
واتە : ئەوانەی داوێنیان ئەپارێزن * مەگەر لە هاوسەرەکانیان یان کەنیزەکەکانیان ئەو کاتە بۆ ئەوانە لۆمەیان لەسەر نیە ، بروانن کەواتە چوونە لای کەنیزەك و هەبوونی دروستەو رێپێدراوە، وە هەرکەسێك جگە لەوانە پەیرەو بکات ئەوە دەستدرێژی کارە.

٢- خوای گەورە ئەفەرمێ -:﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا ﴾[2]
واتە ئەگەر ترسان دادپەروەرنەبن لە خواستنی کچۆلەی بێ باوك ئەوە دوو ژن یان سێ یان چوار بێنن ئەگەر ترسان لەگەل ئەوانیش دادپەروەر نەبن ئەوە هەر یەك هاوسەر بخوازن ، یاخود لەگەل کەنیزەکانتان بن ئەوانتان بەس بێ ، کەواتە کۆبونەوە لەگەل کەنیزەك و هەبوونی چوونە لای شتێکی مەشروعەو خوای گەورە رێی پێداوە .

[1] المؤمنون (٥-٦-٧)

[2] (النساء - ٣ -)

٣- خوای گەورە ئەفەرمێ : ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾[ النور : ٣٢].

واتە : هاوسەرگیری بۆ كوڕە بێ ژنەكانتان و كچە بێ پیاوەكانتان ئەنجام بدەن و ئەوانەشی بەندەو كەنیزەكتانن ، واتە كەنیزەكەكان بدەن بەشوو ئەگەر ویستیان یاخود بەندە كانتان كەواتە بوونی بەندە و كەنیزەك دروستە و كۆمەڵێ حوكمی شەرعی تایبەتی بۆ دارێژراوە.

## كەنیزە و بەبەندە كردن لەسوننەتی پاكی پێغەمبەری پێشەوا﴿ﷺ﴾ :

١- لە بوخاری موسلیم هاتوە عبد الله بن عمر أن رسول الله صلى الله عليه وسلم أغار على بني المصطلق فقتل مقاتلتهم، وسبى ذراريهم، وأصاب يومئذ جويرية ابنة الحارث"

لە عەبدوڵای كوری عومەرەوە فەرموویەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هێرشی كردە سەر بنەماڵە و هۆزی موستەڵەق هەموو شەڕكەرانیانی كوشتن و پاشان ژن و مندالەكانیانی بە كەنیزەك گرت ، لەو رۆژەدا بوو جویریەی كچی حارسی گرت و پاشان كردیە هاوسەری خۆی ، كەواتە پێغەمبەری خوا نەك هەر كەنیزەكی لەشەرەكان گرتوە بەلكو كردویتیە هاوسەری خۆشی .

٢- وفي صحيح مسلم عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه: "أن رسول الله صلى الله عليه وسلم بعث يوم حنين بعثاً إلى أوطاس فلقوا عدوهم فقاتلوهم فظهروا عليهم وأصابوا لهم سبايا، فكأن أناساً من أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم تحرجوا من غشيانهنَّ من أجل أزواجهن من المشركين، فأنزل الله في ذلك: (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ)[النساء: ٢٤] أي فهنَّ لهم حلالٌ إذا انقضت عِدَّتُهُنَّ [عِددُهُنَّ]".اهـ

لە صەحیحی موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە رۆژی حونەین مەفرەزەیەكی نارد بۆ ئەوتاس كە دوژمنی لێ بوو دەسكرایە شەڕ و جەنگ لەگەلیان تا خوای گەورە سەركەوتنی پێ بەخشین ، كەنیزەكیشیان گرت لێیان ، بۆیە هەندێك لە هاوەڵان خۆیان دووركرت لەوەی جیماعیان لەگەل بكەن خوای گەورەش ئەم ئایەتەی

دابەزاند (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ)[1] واتە: ئەو كەنیزەكانە حەلالن بۆ ئێوە ئەگەر عیدەكانیان تەواو بووَ كە پاك بونەوەی مانگێكە .

٣- وفي صحيح البخاري من حديث المغيرة بن شعبة أنه قال لعامل كسرى "أمرنا نبيّنا رسولَ ربنا صلى الله عليه وسلم أن نقاتلكم حتى تعبدوا الله وحده أو تُؤدوا الجزية، وأخبرنا نبينا عن رسالة ربنا أنه من قُتِل منا صار إلى الجنة في نعيم لم يُر مثلُها قط، ومن بقي منا مَلَكَ رقابكم".
لە صەحیحی بوخاری لە فەرموودەی موغیرەی كوڕی شوعبە بەیەكێ خزمەتكارەكانی كیسرای فەرموو : ئێمە پێغەمبەرەكەمان فەرمانی پێكردووین جەنگ و كوشتارتان بكەین تا بەتەنها خوا ئەپەرستن یان سەرانە ئەدەن ، وە پێغەمبەرەكەمان هەواڵی پێداوین لە پەیامی خوای پەروەردگارمان كە هەر كەسێ لەئێمە بكوژرێ بۆ بەهەشتە كە خۆشیەكە كەس وێنەی خۆشی وای نەبینیوە ، ئەوەشی بمێنێ لە ئیمە و نەمرێ **ئەوە گەردنی ئێوەی دەست ئەكەوێ بە كۆیلەكردنتان** . كەواتە كۆیلە و كەنیزەك حوكمێكی شەرعی سابتن پەیوەستە بە مەسەلەی جەنگ و جیهاد و كوفرەوە كەواتە تا كوفر بمێنێ جەنگ و جیهادیش ئەمێنێ بۆیە ئەو حوكمەش ئەمێنێ.

## بەڵگەی ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە بارەی كەنیزەك و بەبەندەكردنی بێباوەڕانەوە :

ابن روشد لە كیتابەكەی بداية المجتهد ئیجماعی صەحابە لەسەر ڕەوایی بەندە و كەنیزە نەقڵ ئەكات ئەفەرمێ: (أجمعت الصحابة بعده صلى الله عليه وسلم على استعباد أهل الكتاب: ذكرانهم وإناثهم)[2].اهـ [بداية المجتهد: ٣١٥/١].
واتە : كۆڕان هاوەلان لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بەكۆیلەكردنی خاوەن پەیامە ئاسمانیەكان بەژن و پیاویانەوە.

---

[1] ( النساء -٢٤-)
[2] ( بداية المجتهد : ٣١٥/١)

## کاتێك ئیسلام هات دوو کاری گرنگی بۆ رێکخستنی ئەم دیاردەیە کرد کە وتمان پێش ئیسلام بوونی هەبوە :

١/ بەندە و کەنیزەك ؛ ئەوەیە لەکاتی شەڕکردن و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بێباوەڕانی جەنگاوەر(محارب)دا موسلمانانن بەدیل دەیانگرن لەچەن دۆخێکدا، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمێ : ( لاتزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين الى يوم القيامة )[1].

واتە : بەردەوام کۆمەڵێك لە ئومەتەکەم کوشتار ئەکەن لەسەر حەق ، ئاشکراو دیارن تا رۆژی دوایی.

وەیەکێك لە عەقیدەکانی ئەهلی سونەت و جەماعەت ئەوەیە کە ئیمامی طەحاوی لەکتیبی عەقیدەکەیدا ئەفەرمێ : (الحج والجهاد ماضيان مع أولي الأمر من المسلمين ، برهم و فاجرهم إلى قيام الساعة ، لابطلهما شيء ولاينقضهما ).

واتە : حەج و جیهاد بەردەوامە لەگەل وەلی ئەمر لە موسلمانان لەگەل چاك و خراپیان هەتا هاتنی رۆژی دوایی ، هیچ شتێك بەتاڵیان ناکات و هەڵیانناوەشێنێتەوە. شێخ عبدالله بن یابس-رحمه الله-ئەفەرموێ لەتعلیقێکی لەکتێبەکەیدا : ( وإذا كان القتال ماضياً إلى قيام الساعة، والكفار موجودين في كل زمن فسنة الإسلام جواز الاسترقاق لمن استولوا عليه بطريق الحرب).

واتە : کە جەنگ و کوشتار ێمێنێ تا رۆژی دوایی ، وە بێباوەڕانیش بونیان هەیە هەموو کاتێك ، ڕێبازی ئیسلام ئەوەیە بکرێنە کۆیلە کاتێك بەڕێگای جەنگ زاڵ بوون بەسەریاندا.

وە دکتۆر عەلی العلیانی ئەفەرموێ لە وەلامێکی دا : (من الأحكام الإسلامية المتعلقة بالجهاد التي حرفها تلاميذ الاستشراق والاستعمار: حكم الرق، حتى إنا نرى بعض أولئك الضعاف المهازيل من قليلي العلم والتقوى الذين أعجبوا بمبادئ الدول الغربية والشرقية من الدول

[1] رواه مسلم

الكافرة والملحدة يعتذرون عن رب العالمين في تشريعه للجهاد، ويعللون إباحة الإسلام للرق بتعليلات ساقطة من عند أنفسهم، لم يدل عليها دليل من كتاب ولا سنة...)

لەو حوکمە ئیسلامیانەی کە پەیوەستە بەجیهادەوە و کەخوێندکارانی رۆژهەڵاتناسان وداگیرکەران گۆریویانە : حوکمی کۆیلە کردنە . ئەبینین ئەوکەسانە بریتین لەکەسانێکی لاواز و سوك و کەم عیلم و تەقوا سەرسام بوونە بە وڵاتانی رۆژئاواو رۆهەڵاتی کافری مولحید ، دەستیانکردوە بەبەهانە هێنانەوە بۆ خوا لەوەی حوکمی جیهادی داناوە ، پاشان رێپێدانی ئیسلام بە کۆیلە کردن ئەبەستنەوە بەکۆمەڵێ هۆکار کە لەهەواو نەفسی خۆیانەوە هێناویانە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە لە قورئان وسونەت.

**وە فەرموویەتی لە وەڵامی ئەوکەسانەی ئەڵێن ئیسلام پێچەوانە نیە لەگەل قەدەغەکردی بریاری نەتەوەیەکگرتوەکان دەربارەی نەهێشتنی کۆیلایەتی :** (هذا كذب صراح وافتراء على الإسلام .... وهل يظن هذا الكاتب أن المسلمين منذ عهد الرسول صلى الله عليه وسلم إلى عام ١٨٤٢م عندما وُقعت اتفاقية دولية تحرم الرق كانوا يعملون غير مباح؟! نعوذ بالله من هذا التحريف المشين)

واتە : ئەمە درۆ و هەلبەستراوێکی ئاشکرایە لەسەر ئیسلام ...ئایا ئەم نوسەرە واگومان ئەبات موسڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەری خواوە ﴿ﷺ﴾هەتا ساڵی ١٨٤٢ز کە گرێبەستی قەدەغەرکردنی(تحریم)کۆیلایەتی کرا خەریکی ئەنجام دانی حەرام بوونە ، پەنا بەخوا لەم دین گۆڕینە ترسناکە.

پاشان ئەوانەی شەڕ دەکەن لەگەڵ ئیسلام و دێنە مەیدانی جەنگ(ئەو ئافرەتانەی لەگەڵ سوپای هێزی کوفری شەرخوازدان) .. موسوڵمان بە موسوڵمان بوونی خوێن و ماڵ و هەموو شتێکی حەرامە زەوت بکرێت، مەگەر بە مافی خۆی، ئەگەرچی بێتە مەیدانی جەنگیش لەگەڵ موسوڵمانان، نەخۆی دەکرێتە بەندە و نەژن و ئافرەتەکانی دەکرێنە کەنیزە، هەروەها ئیسلام خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان(جوولەکە و گاوران)یش ناکاتە بەندە و کەنیزە، ئەوانەی لەنێو موسوڵماناندا دەژین و پەیمانیان هەیە لەگەڵ موسوڵماناندا و دەستەڵاتی ئیسلامی

ئەمان و دڵنیایی داونەتێ..بەلام ئێستا سەرجەمیان لەجەنگدان لە دژی ئیسلام و موسڵمانان هەروەها ئەوانەش کە خاوەنی کتێبێکی ئاسمانی نین وەک بتپەرستان و خاوەن بیرۆکەکانی سەردەم(مارکسیی و شیوعی و عەلمانی و دیموکراسی گاپەرستان و یەزیدی شەیتان پەرست و تەنانەت ئەوانەش کە باوەڕیان بە بوونی خوداش نییە) بونەتە یەك بەرە لەشەڕ و جەنگ لەگەل دەوڵەتی ئیسلامی و موسڵمانان.

شەڕی دروستی ئیسلامیش لەگەڵ بێباوەڕاندا ئەگەر بۆ بەرگری بوو(قتال الدفع) وەک ئەو کاتانەی هێرش دەکرێتە سەر ئیسلام و موسوڵمانان، یاخود شەڕی هێرش کردن دەبێت، ئەویش بۆ بڵاوبوونەوەی دینی خوایە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە دەبێت ئیسلام بگاتە گوێ و دڵی هەموو کەس وەکو خۆی و دەستەڵات و پەرستن تەنها بۆ خوا بێت بۆ ئەوەی هەموو کەس لەژێر دادپەروەری ڕاستەقینەی ئیسلامدا بەدڵنیایی بژین،

بەڵام سەرگەورەی کوفر و خۆپەرستان لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیان و بەکۆیلەکردنی مرۆڤەکان و داگیرکردنی بازاڕەکان و زەوتکردنی هەموو مافەکانی خەڵکی، لێناگەڕین ڕێگا بۆ ئیسلام خۆش بکرێت و بانگەوازی خوایی بەئازادی و ئاسانی بگاتە چاوبەستراو و چەواشەکراوان هەتاوەکو باریان لێ تێک نەچێت، ئەو کات هەوڵی خۆیان دەدەن و سوپا ساز دەکەن و خەڵکانی چەواشکراو هان دەدەن بۆ جەنگی ئیسلام بەهەرچی ناشرین کردن و پڕوپاگەندەیەکی پیس مەرام لەپێناوی ڕقهەڵگیرسان بەرامبەر بە دینی خوا و موسوڵمانان..

لەو ڕووبەڕوو بوونەوەیەدا ئیسلام سێ ڕێگەیان نیشان دەدات هەتا یەکیان هەڵبژێرن؛ باوەڕهێنان و موسوڵمانبوون(ئەو کاتە وەک مسوڵمانان هەموو ماف و پاراستنێکیان دەبێت) یان لەسەر دینی خۆیان دەمینن و بەڵام دێنە ژێر دەستەڵاتی ئیسلامی و سەرانە ئەدەن(بەوەش خوێن و ماڵ و هەموو شتێکیان دەپارێزرێت هەتا ئەو کاتەی پەیمان نەشکێنن) یاخود بڕیاری جەنگ دەکەن و بەشەڕ بارەکە یەکلا دەبێتەوە. هەتا وەکو ئەو سێ هەڵبژاردنەیان نەخرێتە پێش جائیز نییە هێرشیان بکرێتە سەر.

لەپاش هەموو ئەمانە ئەوجا ئەگەر دوژمانان دیلیان بوو، باسی کەنیزە و بەندە دێتە پیش. ئەگەر شەڕ هەڵگیرسا و کوشتار دەستی پێ کرد، ئایا ئەگەر موسوڵمانان بەدیل گیران لە پیاوان و ئافرەتانیان، ئایا بێ باوەڕان چیان لێ بەسەر دێنن!؟

بەدڵنیاییەوە وەڵامەکە ئەوەیە کە دەیانکەنە بەندە و کەنیزەک و دەیانفرۆشن و دەکڕدرێن.. بگرە هەرچی مامەڵەی نامرۆڤانە و دڕندانەیە دەیکەن دەرهەق بەرامبەر گیرا و دیلی موسوڵمان(ئەوەش لە کۆن و نوێدا نمونەی زۆرە، وەک لە گرتووخانەی ئەبووغرێب و گوانتانامۆ...)

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە مانەوەی شەرعییەتی بەکەنیزەکردنی ئافرەتانی بێباوەڕانی شەڕخواز لە مەیدان، یەکێ لە حیکمەتەکانی لەبەرئەوەیە هەتا بێباوەڕان بزانن ئیسلامیش دەتوانێت کاری لەو جۆرە بکات بەرامبەریان هەروەکو چۆن ئەوان دەیکەن دەرهەق بە موسوڵمانان، ئەو کارەش حوکمی نەسخ نەبۆتەوە بەڵکو بەجێماوە بۆ ئەمیر و پێشەوای موسوڵمانان.

جگە لە بەبەندەیی و بە کەنیزەیی دیلەکان لەجەنگدا، ئیسلام ڕێگەی تریشی داناوە، وەک ئازادکردن بەبێ بەرامبەر، بەدیل گۆرینەوە، ئازادکردنیان لەبەرامبەری بڕێک پارە(الفدية).

ئەگەر سەیرێکی مێژووی ڕەنگینی ئیسلام و موسوڵمانان بکەین دەبینین جوانڕەفتاری و ئازادکردنی دیلەکان لەکاتی جەنگدا بەبێ بەرامبەر زۆربەرچاو بوون و لەبەرامبەری ئەوەش زۆرێک لەو دیلانە دڵیان نەرم بووە و موسوڵمان بوون.

هەروەک لەشەڕی بەدر هەروەها لەسەردەمی زێڕینی چوار خەلیفەکە و دواتریش، باپیرەمان سەڵاحەدینی ئەیوبی-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- بەهەزارەها خاچپەرستانی گاوری ئازاد کرد کە هەموویان شەڕخواز بوون و لە ئەوروپاوە هاتبوون و پاش ئەوەش بەدەیان هەزار خوێنی موسوڵمانی بێ تاوانیان ڕشتبوو کاتێک فەلەستین و دەوروبەریان داگیرکرد..

٢/ واڵاکردنەوە و فراوانکردنی دەرگا و ڕێگاکانی ئازادکردنی بەندە و کەنیزەکەکان بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دەستکەوتنی جۆرەها ئەجرو پاداشت.

**هەندێ لەو ڕێگەیانە:**

* نووسینەوەی گرێبەستێک لەنێوانی ئەو و خاوەنەکەی بەوەی کە ئەگەر بۆ نمونە لەماوەیەکی دیاریکراودا ئەگەر ئەوەندە پارەی بۆ پەیداکرد ئەوا دەتوانێت ئازادی خۆی بکڕێتەوە و ببێتە کەسێکی سەربەست، ئەگەر خاوەنەکەی زانی کە ئەو بەندەیە یان کەنیزەکەی کەسێکی گونجاو و لەباربووە لەکۆمەڵگادا و هەروەها دەتوانێت بەو کارە بەشێوەیەکی پاک هەڵبستێت(کار و پیشەیەکی حەلاڵ) ، وە دەبێت پێیان بدرێت لەو ماڵەی کە بۆیانی پەیدا دەکەن هەتاوەکو بتوانن ئازادی خۆیان بکڕنەوەی پێی، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ ﴾[1] . عەبوڵڵای کوڕی صەبیح- خوای لێ ڕازی بێت- لەباوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت باوکم وتی: من موڵکی حوتەیب بووم، داوام لێ کرد هەتا گرێبەستێکم بۆ بنوسێت بۆ ئازادبوونم بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

* خاوەن بەندەیەک/ بۆی نییە فشار بخاتە سەر بەندەکەی/ کەنیزەکەی کە بەڕێگەی ناشەرعی و تاوان و خراپە ئەو پارەیە پەیدابکات یاخود هەربۆئەوەی کەڵکی دونیاییان لێ وەربگرن، بەتایبەتی لەکاتێکدا ئەوان ئەو کارەیان ناوێت و پاکییان دەوێت، هەروەک خوای گەورە ئەفەرموێ :﴿ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[2].

واتە/ زۆر لە کەنیزەکانتان مەکەن(بەکچی خۆیان ناویان دەبات) هەتا بچن زینا بکەن لەپێناوی پارە پەیداکردن بۆتان یان کڕینەوەی ئازادی خۆیان لەکاتێکدا ئەوان دەیانەوێت پاک بن، هەرکەسێک زۆریان لێ بکات ئەوا خوای گەورە لەوان خۆش دەبێت و گەورەکانیان تاوانبارن، خوای گەورەش لەدوای ئەو زۆرلێکردنەیان لێبووردە و بەزەییە.

ئەو ئایەتەش لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مونافیق هاتە خوارەوە کە کەنیزەی هەبوو و

---

[1] ( النور – ٣٣ )

[2] (النور – ٣٣ )

فەرمانی پێدەکرد بەزیناکردن لە سەردەمی نەفامێتیدا. کاتێک ئافرەتەکە زانی کە زینا گوناهە، وتی سوێند بەخوا هەرگیز زینا ناکەم لەمەدوا.

* ئیسلام لە قەرەوەبووی هەندێ گوناه و تاوان ڕزگارکردنی بەندە و کەنیزەکی وەک یاسایەک داڕشتووە، ئەوەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی حوکمێکی شەرعیە چارەسەرێکە بۆ کەفارەتی گوناحەکان خوای گەورە وەك هۆکارباسی کردوە و شەرعاندویەتی کە تۆ بلێی ئەو حوکمە نەماوە و ئێستا کاری پێ ناکرێ کەواتە  ئیسلام بۆ ئەم سەردەمە شیاوی نەماوە و بەکەڵك نایات پەنا بەخوا، ئەوەش کەفارەتی سوێندخواردنە، خوای گەورە دەفەرموێت

﴿ لا يُؤَاخِذُكُمُ اللهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ﴾وە ئەوانەی بەخێزانی خۆیان دەڵێن: وەک دایکیان وایە(الظهار) هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾، یاخود خۆڕزگارکردن لەمەینەتییەکانی قیامەت و لێپرسینەوەی خوا بە ڕزگارکردنی بەندەیەک یان بەتێرکردنی برسییەک لەڕۆژێکی گرانیدا، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ{١١} وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ{١٢} فَكُّ رَقَبَةٍ{١٣} أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ﴾[1].

* هەروەها خوای گەورە پۆلێک لەوانەی پارەی زەکاتی بۆ حەڵاڵ کردوون بەندە و کەنیزەکە هەتاوەکو بتوانن خۆیان ڕزگار بکەن، ئەو ئەجرەش دەست موسڵمانان بکەوێ وە ئەوناکەسانەی موتەئەسیرن بە زەلیلی بوون بۆ عەلمانیەت ئەلێن خوا ئەو حوکمەی نەهێشتوە بە دیاری کردنی ئەو ئایەتانەی کە باسی ئازادکردنیان ئەکات کە کەفارەتن ،منیش ئەڵێم کەوابێ ئەبێ گوناحەکەش بە گوناح نەمابێ چونکە کەفارەتەکەی نەماوە!!!

[1] (البلد : ١١- ١٤)

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[1].

* ئیسلام نەزر بەجێ گەیاندنی بە فەرز ڕاگرتووە، هەرکاتێک کەسێک نەزری کرد لەسەر خۆی کە بەندەیەک ڕزگار بکات یان دیلێک/ کەنیزەیەک، ئەوا پێویست دەبێت لەسەری ئەو نەزرەی بەئەنجام بگەیەنێت هەرکاتێک لەتوانایدا هەبوو، بەڵام کەسێک ئەگەر نەزرێکی حەرامی کرد ئەوا لەسەری واجب نابێت بەجێی بگەیەنێت، پێغەمبەر

﴿ﷺ﴾دەفەرموێت" من نذر أن يطيع الله فليطعه، ومن نذر أن يعصي الله فلا يعصه" دیل و بەندە و کەنیزە ئازاد کردنیش خوا پێی خۆشە و لە گوێڕایەڵی ئەوە(جل جلاله). پێغەمبەر

﴿ﷺ﴾دەفەرموێت"من أعتق رقبة مؤمنة كانت فداءه من النار" صححه الألباني.

واتە/ هەرکەسێک گەردنێکی ئیمانداری ئازاد کرد ئەوە فیدیەی خۆی داوە هەتا لەئاگر ڕزگاری ببێت.

* هەرکەسێک بەندەکەی(پیاو بێت یان ئافرەت) بریندار بکات، بۆ نمونە لێی بدات و برینداری بکات ئەوا ئازاد دەبێت و خاوەنەکەی هیچی بەسەرەوە نامێنێت، جارێکیان پیاوێک لووتی خزمەتکارێکی خۆی بریندار کرد، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾پێی فەرموو: بڕۆ تۆ ئازاد بووی، بەندەکەش وتی: ئەوەی لەمەدوا من سەر بەکێم؟ فەرمووی سەر بە خوا پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾" أن رجلا جدع أنف غلامه فقال صلى الله عليه وسلم: اذهب فأنت حر، فقال: يا رسول الله فمولى من أنا؟ قال صلى الله عليه وسلم: مولى الله ورسوله"

لەڕیوایەتێکی تر؛ ئەوجا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾وەسیەتی کرد بۆ موسوڵمانان هەتا باش بن لەگەڵی، پاشان لەدوای وەفات پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هاتە لای ئەبوبەکر و ئەویش فەرمووی بەڵێ وەسیەتی پێغەمبەر بوو، بۆیە فەرمووی بژێویت بۆ دەبڕینەوە بۆ خۆت و ماڵومنداڵت، دواتریش لەسەردەمی عومەردا دیسانەوە هاتەوە پێش و عەمەریس فەرمووی بەڵێ

[1] ( التوبة : ٦٠ )

وەسیەتی پێغەمبەر بوو، دەتەوێ لەکوێ بژیت؟ وتی: میسر، ئەویش ناردی بۆ میسر و فەرمانی دا بە والی ئەوێ کە عەمری کوڕی عاص بوو پارچەیەک زەوی بداتێ..

* هەرکەسێک بەگاڵتەوە و شۆخییەوە بەبەندەکەی/کەنیزەکەی بڵێت بڕۆ تۆ ئازادی ئەوە دەست بەجێ ئازاد دەبێت، ئەوەش لەبەر دڵڕاگرتنی ئەوانە چونکە مرۆڤن و نابێت هەستیان ئازاربدرێت بەو گاڵتەجاڕییە.

* هەرکاتێک خاوەنی ئەو بەندەیە منداڵێکی لێ ببێت ئیتر بۆی نییە بیفرۆشێت و پاشان ئەگەر بمرێت ئیتر بەندەکە ئازاد دەبێت. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دەفەرموێت"من وطئ أمته فولدت فهي معتقة عن دبر عنه[1] ئەو منداڵەش کەلەدایک دەبێت ئازادە و وەک دایکی نابێتە بەندە.

## بەندە و کەنیزەك لە ئیسلامدا کۆمەڵێ ڕەفتاری زۆر نایاب و جوانیان لەگەڵ کراوە و بۆ دانراوە لەوانە :

١/ پێویستە لە خواردنی خۆتی بدەیتێ و لەپۆشاکی وەک خۆتی لەبەربکەی.. مەعموری کوڕی سوەید دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێک ئەبووذەری غیفاریم-خوای لی ڕازی بێت- بینی بەرگێکی لەبەردا بوو و خزمەتکارێکیشی لەگەڵ بوو بەرگێکی وەک خۆی لەبەرکردبوو، ئێمەش پرسیارمان لێ کرد لەبارەی ئەوە، فەرمووی: جارێکیان قسەم بە پیاوێک وت(سووکایەتیم پێ کرد بەوەی کە کوڕی دایک ڕەشە)، ئەویش سکاڵای بردە لای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ئەوجا پێغەمبەر فەرمووی: ئایا توانجت لێداوە بەدایکی؟! ( لەڕیوایەتێکی تر؛ تۆ کەسێکیت هێشتا نەفامێتیت تێدا ماوە).. پاشان فەرمووی: ئەوانە(ئەو بەندانە) براتانن(لە ئیمانەوە) خوای گەورە کاری ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە، بۆیە هەرکەسێک

---

[1] رواه أحمد و ابن ماجة

برایەکی(لەو بەندانە) لەژێر دەست بوو ئەوا با لەو خواردنەی بداتێ کە خۆی دیخوات و لەو پۆشاکەشی لەبەر بکات کەخۆی لەبەری دەکات، هەروەها کارێکیان مەخەنە ئەستۆ کە نەیتوانن ، وە ئەگەر کردیشتان ئەوا یارمەتییان بدەن. : "رأيت أبا ذر الغفاري وعليه حلة وعلى غلامه حلة فسألناه عن ذلك فقال: ساببت رجلا فشكاني إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال لي النبي صلى الله عليه وسلم: أعيرته بأمه؟! ثم قال: إخوانكم خولكم جعلهم الله تحت أيديكم فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل وليلبسه مما يلبس ولا تكلفوهم ما يغلبهم فإن كلفتموهم ما يغلبهم فأعينوهم".

هەروەها دەفەرموێت ﴿ﷺ﴾"إذا أتى أحدكم خادمه بطعامه فإن لم يجلسه معه فليناوله لقمة أو لقمتين أو أكلة أو أكلتين...".

واتە/ ئەگەر کەسێک لەئێوە خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا، ئەگەر داینەنیشان لەگەڵ خۆی تا لەگەڵی بخوات، ئەوا با پارووەیەک یان دوو پاروو، کەمێک لەو خواردنەوەی بداتێ.

٢/ نابێت هەرگیز لێیان بدرێت و ئازاریان بدرێت، بەتایبەتی لەناهەق..

ئیبن مەسعود-خوا لێی ڕازی بێت- دەفەرموێت: کاتێک بو من لە زخمەتکارەکەی خۆم ئەدا. لەپڕ گوێم لە دەنگێک بوو لەپشتمەوە، دەیووت: بزانە ئەی کوڕی مەسعود(جارێک یان دووجار بوو) ، منیس ئاوڕم دایەوە دەبینم کە پێغەمبەری خوایە، بۆیە قامچییەکەم لەدەست کەوتە خوارەوە، فەرمووی: سوێند بەخوا خوا زۆر بەتوانترە لەسەر تۆ وەک تۆ لەسەر ئەو خزمەتکارە هەتە!

هەروەها ﴿ﷺ﴾دەفەرموێت" من قتل عبده قتلناه، ومن جدع عبده جدعناه، ومن أخصى عبده أخصيناه [1]

واتە/ هەرکەسێک بەندەکەی بکوژێت دەیکوژینەوە، هەرکەسێک بەندەکەی بریندار بکات برینداری دەکەینەوە(لێدانیش دەگرێتەوە)، هەرکەسێک بەندەکەی بخەسێنێت ئەوا دەیخەسێنینەوە(خەساندن، بۆئەوەی هەرئیشی پێبکەن و شەهوەتی نەمێنێت).

[1] رواه أحمد والنسائي و غيرهما

